


# فێربوونی زمانی ئینگلیزی

## لە سەرەتاییەوە بۆ قۆناغی زانکۆ

نووسینی:
ابوبکر احمد خدر
بکالۆریۆس لە زمانی ئینگلیزی – سەلاحەدین

کوردی – ئینگلیزی

کتێبخانە

## ناسنامەی کتێب

**فێربوونی زمانی ئینگلیزی، لە سەرەتاییەوە بۆ زانکۆ**


- نووسینی: ئەبوبەکر ئەحمەد خدر
- بابەت: فێربوونی زمان
- نەخشەسازی و بەرگ: ئیبراهیم ساڵح
- نۆبەتی چاپ: چاپی یەکەم
- ساڵی چاپ: ٢٠١٩
- شوێنی چاپ: چاپخانەی کەنج
- تیراژ: ١٠٠٠

**لەبەڕێوەبەرایەتی گشتی کتێبخانە گشتییەکان ژمارە سپاردن: (١٠٠٨)ی ساڵی ٢٠١٩ی پێدراوە .**


---


**ناونیشان:**

**سلێمانی ـــ سابوونکەران ـــ نێوان گەراجی عوسمانی تەمین و شوقەکانی تەکیە رووتە .**

**ژمارەی مۆبایل: (٠٧٧٠١٥٧٤٢٩٣) (٠٧٥٠١١٩١٨٤٧)**

# فێربوونی زمانی ئینگلیزی لە سەرەتاییەوە بۆ قۆناغی زانکۆ

نوسینی:
**ابوبكر احمد خدر**
بكالۆریۆس لە زمانی ئینگلیزی- زانكۆی سەلاحەدین

# پێڕست

# پێشکەشە...

- بە دایک و باوکی خۆشەویستم، دایک و باوکێک کە هەردەم هاوکارم بوون و پشتیان گرتووم هەر لە سەرەتای ڕۆژانی خوێندنەوە هەتاوەکو ئەم قۆناغەی ئێستا. زۆر سوپاسی شەونخونیان دەکەم و دەستی ماندونەناسیان ماچ دەکەم.
- بە ستافی مامۆستایانی قوتابخانەی زانیاری بنەڕەتی ئەهلی و تەواوی قوتابییەکانم.

دەست خـۆشـی و پێـزان:

دەست خۆشیەکی گەرم و کەم وێنە ئاڕاستەی هاوپیشەی خۆشەویستم زۆر بەڕێز (کەیژین خەلیل) مامۆستا لە پەیمانگای گەشە دەکەم بۆ ڕەخساندن و پێدانی کاتی لە پێناو دەوڵەمەند کردن و بەهێز و بەپێز کردنی ئەم کتابە، جوانیەکی بێ هاوتای بەم کتابە بەخشی بە پێشنیار و تێبنیەکانی و هەڵەچن کردنی، لێرەوە سوپاسی ماندوبون و شەونخونی دەکەم کە وەک هەمیشە هاوکارمە و هیوای بەردەوامی و سەرکەوتنی بۆ دەخوازم...

# پێشەکی

In the name of Allah, the most merciful, the most compassionate

**بەناوی خودای گەورە و میهرەبان**

زۆر سوپاسی بەدیهێنەر دەکەم کە هاوکارم بوو، هێزو وزەی پێ بەخشیم لە نوسین و ئامادەکردنی ئەم کتێبە. بێگومان زمانی ئینگلیزی باڵی بەسەر جیهاندا کێشاوە و بووە بە زمانێکی جیهانی، بەجۆرێک لەناو کورد و کوردستانی ڕەنگیندا ڕەنگی داوەتەوە. یەکێک لە تایبەتمەندیەکانی ئەم زمانە بریتیە لە شارەزا بوون لە کەلتور و داب و نەریتی نەک هەر تەنها ئینگلیزەکان بەڵکو هۆکار و ئامرازێکە بۆ شارەزا بوون و تێگەیشتن لە جموجۆڵ و پێشکەوتن و پێگەیشتنی گەلانی دیکەی جیهان.

زۆر بە پێیوستم زانی کە هەستم بە نوسین و ئامادەکردنی ئەم کتێبە بۆ فێرخوازانی زێدە ئەزیز. هەروەها وەکو خزمەتێک بۆ کتێبخانەی کوردی و ببێت بە مەڵۆیەک بۆ زیادبوونی کتێبی ڕێزمان لە خانە و کتێبخانەی کوردیدا، زۆر هەوڵم داوە بە شێوەیەکی سادە و ئاسان بابەتەکان بەرجەستە بکەم و بە شێوەیەکی ئەوتۆ دایان بڕێژم کە بۆ هەموو ئاستەکانی (سەرەتایی، ناوەندی، ئامادەیی و زانکۆ) سودی هەبێت و جێگەی بایەخ بێت بۆیان. لەلایەکی دیکە هەوڵم داوە بەهەر دوو زمان بەرجەستەی بکەم بۆئەوەی هەموو وشە و دەربڕینێک جێگەی سود و بایەخ بێت بۆ خوێنەران و فێرخوازان.

ئەم کتێبەم بەسەر دوو تەوەرەدا دابەش کردووە بۆئەوەی خوێنەر وەکو خۆی لە شتەکان تێ بگات بە شێوەیەکی زۆر ئاسان. لە تەوەرەی یەکەمدا، خۆمان بە ڕووی ڕێزمانی ئینگلیزیدا دەکەینەوە و گەشتێک بە ناخی ڕێزماندا دەکەین چونکە ڕێزمانیش خاوەنی گرنگی و بایەخی خۆیەتی جا لەهەر زمانێکدا بێت. ئەم تەوەرەیە پێنج بەشی سەرەکی لە خۆ دەگرێت کە، هەر یەکێکیان چەند بەندێک لە خۆیدا دەبینێتەوە. لە بەشی یەکەمدا (دەنگ سازی، ژمارەکان، خاڵبەندی)، لە بەشی دووەمدا (ناو و ڕەناوەکان، ئامرازەکانی پەیوەندی، پلەکانی بەراوردو باڵا)، لە بەشی سێیەمدا (ئامرازەکانی ناسرا و نەناسرا، جۆرەکانی ڕەستە لە ڕووی فرمان و پێکهاتەوە) لە بەشی چوارەمدا (هەموو دەمەکانی ڕێزمانی ئینگلیزی بە ڕانەبرد و ڕابردو تەواو و داهاتوو) شیکراونەوە، بۆ هەریەکێکیشیان سەرجەم ڕێسا و شێوانەکانی (ئەرێ، نەرێ، پرسیاری، نەرێی پرسیاری، بکەر نادیار، و کلکە پرسیار) تاوتوێ کراوە. هەروەها لە بەشی کۆتاییدا واتە بەشی پێنجەم (ڕستە مەرجیەکان و قسەی ڕاستەو خۆ و ناڕاستەوخۆ) شرۆڤە کراون.

لە تەوەرەی دووەمدا، خۆمان بە ڕووی جیهانی دەربڕین و دەستەواژە و زاراوە و پەندی ئینگلیزی دەکەینەوە کە ڕێگایەکی زۆر خێرا و ئاسانن بۆ فێربوونی زمانی ئینگلیزی.

لەم تەوەرەدا هەوڵمداوە دیارترین و باوترین دەستەواژە و دەربڕینی ئینگلیزی بەرجەستە بکەم، بە لەبەر کردن و بەکارهێنانی ئەمانە خوێنەر دەتوانێت بە شێوەیەکی بەرچاو بە زمانی ئینگلزی بدوێت و کەمتر ڕووبەڕووی کۆت و بەربەست ببێتەوە.

لەبەشی یەکەمدا (بابەت و دەربڕینەکانی تایبەت بە ڕۆژ و ساڵ و مانگ و بەروار)م خستوونەڕوو. لەبەشی دووەمدا، (بەشێک لە هاومانا و پێچەوانە و جیاوازی نێوان ئینگلیزی ئەمریکی و بەریتانی)م بەرجەستە کردووە. لەبەشی

سێیەم، (دیارترین دەستەواژەکانی ئینگلیزم شیکردونەوەتەوە بە نمونەوە)، لە بەشی چوارەمدا، (هەندێک لە باوترین دەربڕینەکان)م بەرجەستە کردوون هەروەها لە دوو بەشی کۆتایدا (دیارترین زاراوە و پەندی ئینگلیز)م بەرجەستە کردوون بۆ خوێنەرانی زێدە ئەزی و خۆشەویست.

بەهیوام جێگەی خوێنەرانی ئازیز و خۆشەویست بێت، بێگومان ئەم بەرهەمەش بێ کەم و کورِی نیە، بۆیە داوا لە خوێنەرانی هێژا دەکەم لەگەڵ بەدیکردنی هەر هەڵەیەک ئاگادارم بکەنەوە لە رِێگەی ئەم ژمارە (٠٧٥٠١٩٣١٩٩٥).

ابوبكر احمد خدر

ئێوارەی یەکشەممە ٢٠١٩/١/١٣ قەڵادزێ

# Chapter One
## بەشی یەکەم

In this chapter we focus on English letters, sounds, numbers, punctuation and spelling. To make things easier, I have divided this chapter into four sections and in each section one of the subjects is mentioned.

لەم بەشەدا تیشک دەخەینە سەر پیتەکان، دەنگەکان، ژمارەکان، خاڵبەندی و حینجەکردن. بۆ ئاسانی تێگەیشتن، ئەم بەشەم بەسەر چوار بەندا دابەش کردوە و لەهەر بەندێکدا بابەتێکم شرۆڤەکردووە.

# Section One

# بەندی یەکەم

## English Letters and Sounds

## پیت و دەنگەکان له زمانی ئینگلیزیدا

In English language we have (26) letters and (44) sounds.

لەزمانی ئینگلیزیدا (٢٦) پیت و (٤٤) دەنگمان هەیە.

First One: English Letters.

یەکەمیان: پیتەکانی ئینگلیزی.

We have two kinds of letters in English (the capital ones) and (the small ones)

له ئینگلیزیدا دوو جۆر پیتمان هەیە پیتە (گەورەکان) و پیتە (بچوکەکان).

The capital letters are: پیتە گەورەکان بریتین لە

(A- B - C . D . E . F . G . H . I . J . K . L . M . N . O . P . Q - R . S . T . U . V . W . X . Y - Z)

The small letters are: پیتە بچوکەکان بریتین لە

(a . b . c . d . e . f . g . h . I . j . k . l . m . n . o . p . q . r . s . t . u . v . w . x . y - z)

Second: English Sounds

**دووەم: دەنگەکان لە زمانی ئینگلیزیدا**

We have forty-four sounds in English; these sounds divide into two main groups which are (vowels) and (consonants).

**لە زمانی ئینگلیزیدا چل و چوار دەنگمان هەیە. ئەم دەنگانەش بەسەر دوو بەشی سەرەکیدا دابەش دەبن کە ئەوانیش بریتین لە (دەنگە بزوێنەکان) و (دەنگە نەبزوێنەکان).**

# Vowel Sounds

# دەنگە بزوێنەکان

What are the vowel sounds? How many vowel sounds do we have?

**دەنگە بزوێنەکان چین؟ چەند دەنگی بزوێنمان هەیە؟**

Vowel sounds: are those letters that represent a speech sound made with the vocal tract open. We have (20) vowel sounds, seven of them are short vowels, five of them are long vowels and eight of them are diphthongs. Sometimes, (y and w) can be considered as half-vowels.

**دەنگە بزوێنەکان: دەنگە بزوێنەکان ئەو پیتانە دەگرێتەوە کە بە کرانەوەی کۆئەندامی دەنگ سەرچاوە دەگرن. ئێمە (٢٠) دەنگی بزوێنمان هەیە، حەوت لەمانە بریتین لە دەنگی بزوێنی کورت، پێنج لەمان دەنگی بزوێنی درێژن، هەشتیشیان بریتین لە جووتە بزوێن. هەندێ جاریش پیتەکانی (وای و دەبلیو) بە نیمچە بزوێن هەژمار دەکرێن.**

The vowel letters are:

پیتە بزوێنەکان بریتین لە:

**A , I , O , U , E**

Generally, vowel sounds can be divided into three groups:

بەگشتی، دەنگە بزوێنەکان دابەش دەبن بەسەر سێ بەشدا

The first one: Short vowels, we have (7) short vowel sounds, in which they are:

یەکەمیان: دەنگە بزوێنە کورتەکان، حەوت دەنگی بزوێنی کورتمان هەیە، کە ئەوانیش بریتین لە:

| Short sounds | Pronunciation | Examples |
|---|---|---|
| /æ/ | ئا | Cat, bad, cap |
| /ɪ / | ئـــ | Sister, big, dig |
| /ɒ / | ئۆ | Pop, top, log |
| /ʊ / | ئو | Look, put, would |
| /e/ | ئێ | Bed, hen, pen |
| /ə/ | ئـــ، شوه | Brother, doctor, wooden |
| /ʌ / | ئە | Love, plug, mud |

The second one: Long vowels, we have (5) long vowel sounds, in which they are:

دووەمیان: دەنگە بزوێنە درێژەکان، پێنج دەنگی بزوێنی درێژمان هەیە، کە ئەوانیش بریتین لە:

| Long vowels | Pronunciation | Examples |
|---|---|---|
| /ɑ :/ | ئا | cart, fast, father |
| /ɔ :/ | ئۆ | torn, door, warn |
| /i:/ | ئی | sweet, heat, thief |
| /u:/ | ئوو | moon, blue, grew |
| /ɜ :/ | ئێ | burn, first, term |

The third one: Diphthongs, when two vowel sounds come together, we call them diphthongs. So, we have (8) diphthong vowel sounds. In which they are:

سێیەمیان: جووتە بزوێنەکان، ئەگەر دوو دەنگی بزوێن بەیەکەوە هاتن پێیان دەگوترێت جووتە بزوێنەکان. هەشت جووتە بزوێنمان هەیە، ئەوانیش بریتین لە:

| Sounds | Pronunciation | Examples |
|---|---|---|
| /aɪ / | ئای | My, mind, light |
| /ɔ ɪ / | ئۆی | Boy, coin, toy |
| /aʊ / | ئاو | down, shout, now |
| /eɪ / | ئێی | pain, day, gate |
| /eə/ | ئێیە | Share, care, stairs |
| /ɪ ə/ | ئیيە | fear, beer, here |
| /oʊ / | ئۆو | road, blow, bone |
| /ʊ ə/ | ئووە | pure, cure |

# Consonant Sounds

# دەنگە نەبزوێنەکان

What are the consonant sounds? How many consonant sounds do we have?

دەنگە نەبزوێنەکان چین؟ چەند دەنگی نەبزوێنمان هەیە؟

Consonant sound: is a speech sound that is articulated with complete or partial closure of the vocal tract. We have (24) consonant sounds, these sounds divide into five groups as explained below:

دەنگی نەبزوێن: ئەو دەنگەیە کە بەشێوەیەکی تەواو یان بەشێکی وابەستەی داخرانی کۆئەندامی دەنگە. (٢٤) دەنگی نەبزوێنمان هەیە، ئەم دەنگانەش دابەش دەبن بەسەر پێنج بەشدا، هەروەکو لە خوارەوە ڕوونکراونەتەوە:

The first group: Friction consonants, there are (9) consonant phonemes whose main sounds all have frictions as their most important features. Some of these are voiced and some others are unvoiced, as it explained at the below table.

بەشی یەکەمیان: دەنگە نەبزوێنە لێکخشاوەکان، نۆ دەنگی نەبزوێنمان هەیە کە لە ڕێگەی لێکخشاندنەوە دێنە بوون. هەندێک لەمانەش دەنگدارن و هەندێکیشیان کپ و بێدەنگن. هەروەکو لەم خشتەیەدا ڕوونکراوەتەوە:

| Voiced & weak | | | Unvoiced & strong | | |
|---|---|---|---|---|---|
| /v/ | ڤ | Van | /f/ | ف | Fan |
| / ð/ | ذ | Father | / θ / | ث | Think |
| /z/ | ز | Zipper | /s/ | س | Sea |
| / ʒ / | ژ | Treasure | / ʃ / | ش | Sheep |
| | | | /h/ | ه | Hope |

The second group: Stop consonants, while expressing these sounds the breath is completely stopped at some point in the mouth, lips have a great role to express these sounds. We have (8) stop consonants, as it explained at the below table.

بەشی دووەمیان: دەنگە نەبزوێنە وەستاوەکان، لەکاتی دەربڕینی ئەم دەنگانەدا هەناسە بەتەواوەتی لەدەمدا دەوەستێت و لێوەکان ڕۆڵێکی گرنگیان هەیە بۆ دەربڕینی ئەم دەنگانە. ئەم دەنگانەش هەشت دانەن. هەروەکو لەم خشتەیە شیکراوەتەوە:

| Weak | | | Strong | | |
|---|---|---|---|---|---|
| /b/ | ب | Book | /p/ | پ | Pen |
| / d/ | د | Dog | / t / | ت | Ten |
| /g/ | گ | Good | /k/ | ک | Key |
| / ʧ / | چ | Teacher | / ʤ/ | ج | Joke |

**The third group:** Nasal consonants, there are (3) phonemes in English which are represented by nasal consonants, as it explained at the below table:

**بەشی سێیەمیان:** بریتیە لەو دەنگە نەبزوێنانەی کە لەڕێگەی لوتەوە دێنە بوون، ئەم دەنگانەش سێ دانەن. هەروەکو لەم خشتەیەی خوارەوە ڕوونکراوەتەوە:

| Sounds | Pronunciation | Examples |
|---|---|---|
| /m/ | م | Man |
| /n/ | ن | Net |
| / ŋ/ | نگ، نک | Sing, think |

**The fourth group:** Lateral consonant, while pronouncing this sound the breath passing down the centre of the mouth, as it explained at the below table.

**چوارەمیان:** بریتیە لە دەنگی نەبزوێنی لاوەکی، لەکاتی دەرخستنی ئەم دەنگە هەناسە بەناوەندی دەمدا گوزەر دەکات، هەروەکو لەم خشتەیە بەرجەستە کراوە.

| Sounds | Pronunciation | Examples |
|---|---|---|
| /l/ | ڵ، ل | Light, small |

There are **two** kinds of /l/ sound.

دوو جۆر پیتی (ل)مان هەیە.

The first one: is, light /l/, when it comes at the beginning of the word or before one of these letters (a, i, o, u, e, y), for example:

یەکەمیان: بریتیە لە (ل)ی سوک، کە لە سەرەتای وشە یان لە پێش یەکێک لەم پیتانە دێت (لەی، ئای، ئۆو، یو، ئی، وای)

Land, light, long, luck, lemon, slowly…

The second one: is, dark /l/, when it comes at the end of the word or after consonant sounds, for example:

دووەمیان: بریتیە لە (ڵ)ی قورس، ئەمەش لە کۆتایی وشە یان لەدوای دەنگە نەبزوێنەکان دێت، بۆ نموونە:

Small, tall, battle, cold, …

The fifth group: Gliding consonants, there are (3) consonants which consist of quick, smooth, non-friction towards a following vowel sound, as it explained at the below table.

بەشی پێنجەم: ئەمانەش ئەو دەنگە نەبزوێنانە دەگرێتە کە بەشێوەیەکی خێرا و ساف و بێ خشکان دێنە بوون لەگەڵ ئەو دەنگەی کە بەدوایاندا دێت، سێ دەنگمان لەم شێوەیە هەیە، هەروەکو لەم خشتەیە شیکراوەتەوە.

| Sounds | Pronunciation | Examples |
| --- | --- | --- |
| /j/ | یـــ | Yes |
| /w/ | و | Water |
| /r/ | ڕ، ر | Red, breath |

# Some crucial points about English sounds

## چەند تێبینیەکی گرنگ دەربارەی دەنگەکانی ئینگلیزی

1- What is the difference between hard (G) and soft (G)?

جیاوازی چیە لە نێوان پیتی (جی) قورس و (جی) سوک.

Hard g, is a sound that comes before (a, o, u). Here it sounds as (g), for example.

جی قورس، دەنگێکە کە لە پێش (ئەی، ئۆ، یو) دێت، لێرەشدا ئەم دەنگە بە (گ) دەخوێنرێتەوە، وەکو ئەم نمونانە.

gas, goat, gum.

But, soft g, is a sound that comes before (e, i, y). Here it sounds as (ʤ), for example:

بەڵام، جی سوک، لە پێش پیتەکانی (ئی، ئای، وای) دێت و لێرەدا دەنگی (جی) دەدات، بۆ نمونە.

Gem, giant, gym.

***     ***     ***

2- What is the difference between hard (C) and soft (C)?

جیاوازی چیە لە نێوان پیتی (سی) قورس و (سی) سوک.

Soft c, is a sound that comes before (e, i, y). Here it sounds as /s/, for example:

سی سوک، لە پێش پیتەکانی (ئی، ئای، وای) دێت و لێرەدا دەنگی (س) دەدات، بۆ نمونە.

Juice, pencil, icy.

But, hard c, is a sound that comes before (all other sounds besides the three above sounds). Here it sounds as /k/, for example:

**بەڵام سی قورس، دەنگێکە کە لە پێش (هەموو دەنگەکانی دیکەوە دێت جگە لەو سێ دەنگەی سەرەوە نەبێت)، لێرەشدا ئەم دەنگە بە (ک) دەخوێنرێتەوە، وەکو ئەم نمونانە.**

Cap, cut, coast...

❊❊❊ ❊❊❊ ❊❊❊

3- There are some letters which come together and make /ʃ / sound, for instance:

**چەند پیتێک پێکەوە دێن و دەنگی (ش) دروست دەکەن، بۆ نمونە:**

| | | |
|---|---|---|
| - sion | Permission, session. | /ʃ / |
| - cial | social, special, crucial | /ʃ / |
| - ient | ancient, sufficient, patient. | /ʃ / |
| - tial | essential, substantial, partial | /ʃ / |
| - tion, | lotion, portion, station. | /ʃ / |
| - su | sugar, sure, insurance. | /ʃ / |
| - ch | Machine, moustache | /ʃ / |
| - cious | gracious, delicious | /ʃ / |
| - ssure | Pressure | /ʃ / |

*** *** ***

4- In Kurdish we do have two sounds. So, they come out from these letters:

لە کوردیدا دوو دەنگمان هەیە کە لەم پیتانەوە سەرچاوە دەگرن:

- zh, stands for (ژ), for example; Zhinas, Zhino.
- kh, stands for (خ), for example; Khidir, Khalid.

*** *** ***

5- (ch) makes three different sounds, like.

پیتەکانی (سی -ئێچ) سێ دەنگی جیاواز دروست دەکەن.

- /ʃ/ (ش) machine, moustache
- /ʧ/ (چ) change, chair
- /k/ (ک) school, ache

*** *** ***

6- /ʤ/ (ج) sound can be made of the following letters, for example:

هێمای دەنگی (ج) دەکرێت لەم پیتانەی خوارەوە دبێتە بوون، بۆ نموونە:

| | |
|---|---|
| Gi | Giraffe |
| Ge | Bridge |
| J | Joke |

*** *** ***

7- There are some letters which come together and make /ʧ/ sound, for instance:

هەندێک پیت بوونیان هەیە کە پێکەوە دێن و هێما دەنگی (چ) دروست دەکەن، بۆ نموونە:

| | | |
|---|---|---|
| - ch | Church, torch, chair, . | / ʧ/ |
| - ich | Witch, pitch. | / ʧ / |
| - tu | Picture, nature, statue. | / ʧ / |
| - tion | Question, exhaustion, digestion | / ʧ / |

❊❊❊ ❊❊❊ ❊❊❊

8- There are some letters which come together and make /f/ sound, for instance:

هەندێک پیت بوونیان هەیە کە پێکەوە دێن و هێما دەنگی (ف) دروست دەکەن، بۆ نموونە:

| | | |
|---|---|---|
| - f | Frog, leaf, fish. | /f/ |
| - ff | Muffin, toffee, off. | /f/ |
| - ph | Dolphin, phone, photographer. | /f/ |
| - gh | Enough, rough, laugh. | /f/ |
| - ffe | Giraffe, chauffeur, offer. | /f/ |

❊❊❊ ❊❊❊ ❊❊❊

9- Rules for the correct pronunciation of the .d ending.

هەندێک ڕێسا بۆ خوێندنەوەیەکی دروستی پاشگری (دی).

Rule 1: If a word ends with (t and d), then .ed sounds as /id/, such as:

یاسای یەکەم: ئەگەر هاتوو وشەیەک کۆتایی بە (تی یان دی) هات ئەوا پاشگری (ئی دی) بە (ئید) دەخوێنرێتەوە، وەکو:

Want . wanted, add- added.

Rule 2: If a word ends with unvoiced sounds like (p, k, f, s, ʧ , ʃ ), then .ed sounds as /t/, such as:

یاسای دووەم: ئەگەر هاتوو وشەیەک بە هێما دەنگی کپ وەکو (پ، ک، ف، س، چ، ش) هات ئەوا بە (ت) دەخوێنرێتەوە، وەکو:

Stop- stopped, talk - talked, laugh - laughed, kiss - kissed, watch - watched, wash - washed.

Rule 3: If a word ends with voiced sounds, then .ed sounds as /d/, such as:

یاسای سێیەم: ئەگەر وشەیەک بە هێمای دەنگی دەنگداردا کۆتایی هات ئەوا (ئی دی) بە (د) دەخوێنرێتەوە، وەکو:

Love . loved, clean . cleaned.

*** *** ***

10- Rules for the correct pronunciation of the .s ending.

چەند ڕێسایەک بۆ خوێندنەوەی دروستی پاشگری (ئێس).

Rule 1: If a word ends with these sounds /s/, /z/, /ʃ /, /ʧ /, or /ʤ/ the final .s is pronounced as /iz/, such as:

یاسای یەکەم: ئەگەر وشەیەک بە یەکێک لەم دەنگانە (س، ز، ش، چ یان ج) کۆتایی هات ئەوا پاشگری (س) بە (ئیز) دەخوێندرێتەوە، وەکو.

Kiss . kisses, wash . washes, watch . watches, judge . judges.

Rule 2: If a word ends with any voiceless consonant sound (/p/, /t/, /k/, /f/ or /θ/), the final .s is sounded as /s/, such as:

یاسای دووەم: ئەگەر وشەیەک کۆتایی بە هێما نەبزوێنە کپەکان وەکو (پ، ت، ک، ف یان ث) هات، ئەوا پاشگری (ئێس) بە (س) دەخوێندرێتەوە، وەکو:

Stop . stops, want . wants, talk . talks, laugh . laughs, think . thinks

Rule 3: If a word ends with any other voiced consonant sound it sounds as /z/, such as:

یاسای سێیەم: ئەگەر وشەکە کۆتایی بە هەرکامێک لە هێما بزوێنە دەنگدارەکان هات ئەوا بە (ز) دەخوێنرێتەوە، وەکو:

Dog . dogs, color . colors…

**Lightning never strikes twice in the same place.**

مرۆڤی ژیر
دوجار مار لەکونێکەوەی
پێیوەنادات.

# Silent Letters

# پیتە کپەکان

## What is a silent letter?

**مەبەستمان لە پیتی کپ چیە؟**

A silent letter: is a letter that must be included when you write the word even though you don't pronounce it.

**پیتی کپ: ئەو پیتەیە کە لەکاتی نوسیندا دەبێت بنوسرێت بەڵام لە خوێندنەوەدا ناخوێنرێتەوە.**

Rule 1: (t) is silent when it comes before (le, en, ch) letters, for example:

**ڕێسای یەکەم: پیتی (تی) ناخوێندرێتەوە ئەگەر لە پێش پیتەکانی (ئێڵ ئی، ئی ئێن، سی ئێچ) بێت، بۆ نمونە:**

Cas*t*le, lis*t*en, wa*t*ch

*** *** ***

Rule 2: (l) is not pronounced after the vowels (a, o, u), for example:

**ڕێسای دووەم: پیتی (ئێڵ) ناخوێندریتەوە ئەگەر لە دوای پیتە بزوێنەکانی (ئەی، ئۆو، یو) بێت، بۆ نمونە:**

ca*l*m, ha*l*f, ta*l*k, wa*l*k, wou*l*d, yo*l*k

*** *** ***

Rule 3: (k) is silent when it comes before (n) at the beginning of the word, for example:

ڕێسای سێیەم:پیتی (کەی) پیتێکی کپە ئەگەر لە پێش پیتی (ئێن) بێت لەسەرەتای وشەدا، بۆ نمونە:

know, knock, knee

*** *** ***

Rule 4: Most of the times, when (g) comes before (n), (g) is silent, for example:

ڕێسای چوارەم: لەزۆربەی کاتدا، ئەگەر پێتی (گ) لەپێش پیتی (ئێن) بێت، ئەوا پیتی (گ) ناخوێندرێتەوە، بۆ نمونە:

resign, sign, foreign

*** *** ***

Rule 5: (b) is silent when it comes after (m), especially at the one syllable words, for example:

ڕێسای پێنجەم: پیتی (بی) ناخوێندرێتەوە ئەگەر لەدوای (ئێم) بێت بەتایبەتیش لە وشە یەک برگەییەکان، بۆ نمونە:

lamb, climb, tomb

*** *** ***

Rule 6: (w) is silent when it comes before (r) at the beginning of the word, for example:

ڕێسای شەشەم: پیتی (دەبلیو) ناخوێنرێتەوە ئەگەر لە پێش پیتی (ئاڕ) بێت لەسەرەتای وشەدا، بۆ نمونە:

write, wrong, wrist

*** *** ***

Rule 7: (h) is silent when it comes before (o) at the beginning of the most words, for example:

ڕێسای حەوتەم: پیتی (ئێچ) ناخوێنرێتەوە ئەگەر لە پێش پیتی (ئۆو) بێت لە سەرەتای زۆربەی وشەکاندا، بۆ نمونە:

hour, honor

*** *** ***

Rule 8: (b) is silent when it comes before (t) letter, for example:

ڕێسای هەشتەم: پیتی (بی) ناخوێنرێتەوە ئەگەر لە پێش پیتی (تی) بێت، بۆ نمونە:

debt, doubt, subtle

*** *** ***

Rule 9: (d) is silent when it comes before (g), here it sounds as (ʤ) for example:

ڕێسای نۆیەم: پیتی (دی) پیتێکی کپە ئەگەر لە پێش پیتی (گ) بێت، کە لێرەدا دەنگی (جی) دەدات، بۆ نمونە:

bridge, judge, fidget

Rule 10: (n) is silent when it comes after (m) at the end of the most words, for example:

ڕێسای دەیەم: پیتی (ئێن) ناخوێندرێتەوە کاتێک لە پێش پیتی (ئێم) بێت لە کۆتایی زۆربەی وشەکاندا، بۆ نمونە.

autumn, condemn, hymn

*** *** ***

Rule 11: In the following words (d) is silent.

ڕێسای یازدەیەم: لەم وشانەی خوارەوەدا پیتی (دی) ناخوێنرێتەوە.

Handsome, sandwich, Wednesday

*** *** ***

Rule 12: In the following words (w) is silent.

ڕێسای دوازدەیەم: لەم وشانەی خوارەوە پیتی (دەبلیو) ناخوێندرێتەوە.

Who, whose, whom…

*** *** ***

Rule 13: In the following words (h) is silent.

ڕێسای سێزدەیەم: لەم وشانەی خوارەوەدا پیتی (ئێچ) ناخوێندرێتەوە.

What, why, when…

*** *** ***

Rule 14: (u) is silent in the following words.

ڕێسای چواردەیەم: پیتی (یو) لەم وشانەی خوارەوەدا ناخوێندرێتەوە.

Guess, guard, tongue

*** *** ***

Rule 15: (gh) is not pronounced when it comes after a vowel, for example:

ڕێسای پازدەیەم: پیتەکانی (جی ئێچ) ناخوێندرێتەوە ئەگەر لە دوای پیتە بزوێنەکان هات، بۆ نموونە:

Light, right, night

*** *** ***

Rue 16: (e) is not pronounced in the end of the most one syllable words, for example:

ڕێسای شازدەیەم: پیتی (ئی) ناخوێندرێتەوە لەکۆتایی زۆربەی وشە یەک برگەییەکاندا. بۆ نموونە:

Come, love, give

*** *** ***

Rule 17: (s) is not pronounced after (l) in the following words, for example:

**ڕێسای حەڤدەیەم: پیتی (ئێس) ناخوێندرێتەوە کاتێک لە دوای پیتی (ئای) بێت، بۆ نموونە:**

Island, isle, aisle, islet

# Section Two

# بەندی دووەم

## Numbers in English

## ژمارەکان لە ئینگلیزیدا

We have two kinds of numbers in English, (Cardinal Numbers) and (Ordinal Numbers).

لە ئینگلیزدا دوو جۆر ژمارەمان هەیە، (ژمارە بنچینەکان) و (ژمارە ڕێکخراوەکان).

# Cardinal Numbers

## ژمارە بنجیەکان

A Cardinal Number: is a number that says how many of something are there , such as one, two, three, four, five.

ژمارە بنجیەکان: ئەو ژمارانە دەگرنەوە کە پێمان دەڵێن چەند شت بونیان هەیە، بۆ نمونە، یەک، دوو، سێ، چوار، پێنج.

I have one car.

I saw three men.

من سەیارەیەکم هەیە.

سێ پیاوم بینی.

| No. | Ones | No. | Teens | No. | Tens | No. | Twenties |
|---|---|---|---|---|---|---|---|
| 0 | zero | 10 | Ten | 10 | Ten | 20 | Twenty |
| 1 | one | 11 | Eleven | 20 | twenty | 21 | Twenty-one |
| 2 | two | 12 | Twelve | 30 | thirty | 22 | Twenty-two |
| 3 | three | 13 | Thirteen | 40 | forty | 23 | Twenty-three |
| 4 | four | 14 | Fourteen | 50 | fifty | 24 | Twenty-four |
| 5 | five | 15 | Fifteen | 60 | sixty | 25 | Twenty- |

| | | | | | | | |
|---|---|---|---|---|---|---|---|
| | | | | | | | five |
| 6 | six | 16 | Sixteen | 70 | seventy | 26 | Twenty-six |
| 7 | seven | 17 | Seventeen | 80 | eighty | 27 | Twenty-seven |
| 8 | eight | 18 | Eighteen | 90 | ninety | 28 | Twenty-eight |
| 9 | nine | 19 | Nineteen | | | 29 | Twenty-nine |

**You reap what you saw.**

**چ بچێنی**
**هەر ئەو دەدرویتەوە.**

| No. | Thirties | No. | hundreds | No. | thousands |
|---|---|---|---|---|---|
| 30 | Thirty | 100 | One-hundred | 1,000 | One-thousand |
| 31 | Thirty-one | 200 | Two-hundred | 10,000 | Ten-thousand |
| 32 | Thirty-two | 300 | Three-hundred | 100,000 | One hundred thousand |
| 33 | Thirty-three | 400 | Four-hundred | 1,000,000 | One million |
| 34 | Thirty-four | 500 | Five-hundred | 10,000,000 | Ten million |
| 35 | Thirty-five | 600 | Six-hundred | 100,000,000 | One hundred million |
| 36 | Thirty-six | 700 | Seven-hundred | 1,000,000,000 | One billion |
| 37 | Thirty-seven | 800 | Eight-hundred | 10,000,000,000 | Ten billion |
| 38 | Thirty-eight | 900 | Nine-hundred | 100,000,000,000 | One hundred billion |
| 39 | Thirty-nine | | | 1,000,000,000,000 | One trillion |

# Ordinal Numbers

# ژمارە ڕێکخراوەکان

An Ordinal Number: is a number that tells the position of something in a list, for example, first, second, third, fourth, fifth.

ژمارە ڕێکخراوەکان: ئەو ژمارانە دەگرێتەوە کە جێگە و پێگەی شتێک لە لیستێکدا دیاری دەکەن، بۆ نمونە: یەکەم، دووەم، سێیەم، چوارەم، پێنجەم.

Sami was the first one in the class.

Khidir got the fifth degree in the competition.

سامی یەکەم بوو لە پۆلەکەدا.

خدر لە پێشبڕکێکەدا پلەی پێنجەمی بەدەست هێنا.

| $1^{st}$ | First | $11^{th}$ | eleventh | $21^{st}$ | Twenty first |
|---|---|---|---|---|---|
| $2^{nd}$ | Second | $12^{th}$ | twelfth | $22^{nd}$ | Twenty second |
| $3^{rd}$ | Third | $13^{th}$ | thirteenth | $23^{rd}$ | Twenty third |
| $4^{th}$ | Fourth | $14^{th}$ | fourteenth | $30^{th}$ | Thirtieth |
| $5^{th}$ | Fifth | $15^{th}$ | fifteenth | $40^{th}$ | Fortieth |
| $6^{th}$ | Sixth | $16^{th}$ | sixteenth | $50^{th}$ | Fiftieth |
| $7^{th}$ | Seventh | $17^{th}$ | seventeenth | $60^{th}$ | Sixtieth |
| $8^{th}$ | Eighth | $18^{th}$ | eighteenth | $70^{th}$ | Seventies |
| $9^{th}$ | Ninth | $19^{th}$ | nineteenth | $80^{th}$ | Eighties |

# Reading Fractions

## چۆنیەتی خوێندنەوەی کەرتەکان

Use the cardinal number for the numerator and the ordinal number for the denominator, making the ordinal number plural if the numerator is larger than 1. This applies to all numbers except for number 2, which is read as "half" when it is the denominator. As I mentioned in the table.

بۆ چۆنیەتی خوێندنەوەی کەرتەکان، ژمارە بنچیەکان لەسەر کەرتەکان دابنێ و ژمارە تەرتیبیەکانیش بخە ژێرکەرتەکە، ژمارەی ژێرکەرتەکە بکە بە کۆ ئەگەر سەری کەرت لە ژمارە یەک زیاتر بێت. ئەمە بەسەر هەموو ژمارەکاندا جێبەجێ دەبێت تەنیا بۆ ژمارە دوو نەبێت کە بە "نیوە" دەخوێنرێتەوە ئەگەر هاتوو لە ژێر کەرتدا بوو. هەروەکو لە خشتەکەدا ئاماژەم پێکردوە:

| Written | Said | Written | Said |
|---|---|---|---|
| 1/2 | a (one) half | 1/3 | a (One) third |
| 1/3 | a (one) third | 3/4 | Three fourths- three quarters |
| 1/4 | a quarter (a fourth) | 5/6 | Five sixths |
| 1/5 | a (One) fifth | 1/8 | an eighths |
| 1/10 | a (One) tenth | 3/5 | Three fifths |

# Pronouncing the Percentages

# چۆنیەتی خوێندنەوەی ڕێژەی سەدی

Percentages are easy to read in English. Just say the number and then add the word "Percent". As I mentioned in the table.

له ئینگلیزیدا خوێندنەوەی ڕێژەی سەدی زۆر ئاسانە، تەنیا ژمارەکە دەخوێنیتەوە و "ڕێژەی سەدی" لەگەڵ دەڵێیت. هەروەکو لە خشتەکەدا ئاماژەم پێکردوە:

| Written | Pronounced |
|---|---|
| 5% | Five percent |
| 25% | Twenty- five percent |
| 36.25% | Thirty- six point twenty- five percent |
| 100% | One hundred percent |
| 500% | Five hundred percent |

## Pronouncing Measurements

## چۆنیەتی خوێندنەوەی پێوانەکان

Reading measurements is not difficult, just read out the number, followed by the unit of measurement, which will often be abbreviated in the written form. As I mentioned in the following table.

**چۆنیەتی خوێندنەوەی پێوانەکانێش سەخت نیە، تەنیا ژمارەکە بخوێنەوە و لەگەڵ ئەو کورتکراوەیە کە لەگەڵیەتی. هەروەکو لەم خشتەیەی خوارەوەدا ئاماژەم پێکردوە:**

| Written | Spoken |
|---|---|
| 40 m | Forty meters |
| 25 km/h | Twenty-five kilometers per hour |
| 10 ft | Ten feet |
| 3 l | Three liters |
| 1 tsp | One tea spoon |

# Pronouncing Years

# چۆنیەتی خوێندنەوەی ساڵ

Years ساڵ

For years up to 2000, separate the four numbers into two pairs of two:

**بۆ خوێندنەوەی ساڵەکان هەتاوەکو ساڵی (٢٠٠٠) دوو ژمارەی سەرەتا بە جیا و دوو ژمارەی کۆتایی بەجیا بخوێنەوە.**

* 1965 = "nineteen sixty-five"
* 1871 = "eighteen seventy-one"
* 1999 = "nineteen ninety-nine"

For the decade 2001 - 2010, you say "two thousand and ---- "

**بۆ خوێندنەوەی ئەو ساڵانەی کە لە دوو هەزار زیاترن (٢٠٠١- ٢٠١٠)، سەرەتا دەڵێین "دوو هەزار" پاشان ژمارەکەی دیکە دەردەبڕین...**

* 2001 = "two thousand and one"
* 2009 = "two thousand and nine"

However, from 2010 onwards you have a choice.

لەگەڵ ئەوەشدا، لەسەروی ساڵی (٢٠١٠)وە هەڵبژاردەت لەبەر دەستدایە بۆ خوێندنەوە.

For example, 2012 can be either "two thousand and twelve" or "twenty twelve".

بۆ نمونە، ساڵێ (٢٠١٢) دەتوانی بە دوو شێوە بیخوێنیەوە، دەتوانی بڵێی: توو ثاوزەند ئاند توێڵف یاخود توێنتی توێڵف.

Large Numbers ژمارە گەورەکان

Divide the number into units of hundreds and thousands, like the below examples:

ژمارەکە بکە بە دوو بەشەوە لە نێوان سەدەکان و هەزارەکان، وەکو ئەم نمونانەی خوارەوە:

400,000 = "four hundred thousand" (no s plural)

- ❋ 450,000 = "four hundred and fifty thousand"
- ❋ 400,360 = "four hundred thousand and three hundred and sixty"
- ❋ 1900 = "nineteen hundred"
- ❋ 1600= "sixteen hundred"
- ❋ 866= "eighty hundred sixty six or eighty sixty six"

## Saying (0) چۆنیەتی گوتنی ژمارە سفر

Depending on the context, we can pronounce zero in different ways:

چۆنیەتی خوێندنەوەی ژمارە (سفر) لە ئینگلیزیدا دەکەوێتە سەر دەقدکە، لەبەر ئەمەش بەچەند شێوەیەکی جیاواز دەتوانین (سفر) دەرببڕین:

- 2-0 (football) = "Two nil"

لەیاری تۆپی پێدا ئەگەر یاریەکە دوو بە سفر بێت ئەوا دەڵێین (توو نیڵ).

- 30 - 0 (tennis) = "Thirty love"

لە یاری تێنسدا ئەگەر یاریەکە سێ بە سفر بێت ئەوا دەڵێین (ثێرتی لەڤ).

- 604 7721 (phone number) = "six oh four…"]

لە ژمارەی تەلەفۆندا (سفر) بە (ئۆ) دەخوێندرێتەوە وەکو: (سکس ئۆو فۆر دەبڵ سێڤن توو وەن).

- 0.4 (a number) = "nought point four" or "zero point four"

لە پۆینتاتدا (سفر) بە (نۆت) دەخوێندرێەوە وەکو (نۆت پۆینت فۆر) یان (زیرۆ پۆینت فۆر).

- 0C (temperature) = "zero degrees"

لە پلەی گەرمیدا (سفر) هەر بە سفر دەخوێندرێتەوە وەکو: سفر پلەی سەدی.

# Section Three

# بەندی سێیەم

## Capitalization and Punctuation Rules

## ڕێساکانی خاڵبەندی و نوسینی پیتی گەورە

### Capitalization

### نوسینی پیتی یەکەم بە پیتی گەورە

Rule1: Capitalize the first word of a quoted sentence.

ڕێسای یەکەم: پیتی یەکەمی گوتە بە گەورەیی بنوسە.

Sara said, "Treat her as you would your own daughter."

"Look out!"

***　***　***

Rule 2: Capitalize a proper noun.

ڕێسای دووەم: یەکەم پیتی ناوی تایبەت بە گەورەیی بنوسە.

Qaladze, Ali, England

***　***　***

Rule 3: Name of the streets, cities and states.

ڕێسای سێیەم: یەکەم پیتی ناوەکانی شەقام و شار و وڵات بە گەورەیی بنوسە.

Ashtry Street, Erbil, United States.

*** *** ***

Rule 4: The title of stories, movies and TVs

ڕێسای چوارەم: یەکەم پیتی ناونیشانی چیرۆک و فیلم و تەلەفزیۆنەکان بە گەورەیی بنوسە.

"Romeo and Juliet", "The Monkey's Paw" , "BBC"

*** *** ***

Rule 5: The names of days, months, and holidays.

ڕێسای پێنجەم: یەکەم پیتی ناوەکانی ڕۆژ و مانگ و پشوەکان بە گەورەیی بنوسە.

Sunday, January, Nuroz

*** *** ***

Rule 6: The first word of a sentence.

ڕێسای شەشەم: پیتی یەکەمی یەکەم وشەی ڕستە بەگەورەیی بنوسە.

She is a pretty girl.

ئەو کچێکی جوانە.

*** *** ***

# Punctuation

# خاڵبەندی

## Commas (,)

## کۆما

It indicates a separation of ideas or elements within the structure of a sentence.

**کۆما: جیاکردنەوەی بیرۆکە و بەشەکانی ناو پێکهاتەی ڕستەیەک بەرجەستە دەکات.**

Always use a comma to separate…

**هەمیشە کۆما بۆ جیاکردنەوەی ئەمانەی خوارە بەکاربهێنە...**

Rule 1: Two or more adjectives.

**ڕێسای یەکەم: ئەگەر لە ڕستەیەکدا دوو یان زیاتر لە دوو ئاوەڵناومان هەبێت.**

He is a clever, smart boy. **ئەو کوڕێکی قشت و زیرەکە**

Rule 2: Items in a list.

**ڕێسای دووەم: ئەگەر لیستی چەند ئامرازێکمان هەبێت.**

Please buy eggs, milk, butter and flour.

**تکایە هێڵکە، شیر، کەرە و ئارد بکڕە.**

Rule 3: The name of a city from the name of a state.

**ڕێسای سێیەم: ناوی شار و دەوڵەت.**

I live in Washington, United States.

Rule 4: Two independent clauses.

ڕێسای چوارەم: ئەگەر دوو ڕستەی سەربەخۆمان هەبێت.

The waiter still hasn't taken our order, and the play starts in five minutes.

Rule 5: Direct quotations.

ڕێسای پێنجەم: ئەگەر گوتەیەکی ڕاستەخۆمان هەبێت.

Tell me, 'how did you know that?'

*** *** ***

## Quotation Marks نیشانەی (" ") وەرگرتن

It marks the beginning and end of a quotation or title of a short work.

ئەم نیشانەیە سەرەتا و کۆتای گوتەیەک یان ناونیشانی کارێکی بچوک نیشان دەدات.

Rule 1: Spoken by someone.

ڕێسای یەکەم: قسەیەک کە لەلایەن کەسێک کراوە.

"I love to read chapter books," said Sally.

Rule 2: Newspaper articles, title of poems, songs, short stories…

ڕێسای دووەم: گوتاری ڕۆژنامە و ناونیشانی شعر و گۆرانی و کورتە چیرۆک...

"The Love of a King" by Peter Dainty

***   ***   ***

## Brackets or Parentheses                {}, [], () کەوانە

It is a set of elements within a sentence that are related to the sentence but nonessential.

کەوانە لەو حاڵەتانەدا بەکاردەهێنرێت کە لە ڕستەیەکدا شتێکی پەیوەندیدار بە ڕستەکە هەیە بەڵام گرنگ نیە بونی هەبێت.

There are several books on the subject (see page 50).

***   ***   ***

## Apostrophes                ' کۆمای

سەرەوە

It shows possession and also indicates where a letter has been omitted to form a contraction.

ئەم کۆمایە خاوەنداریەتی بەرجەستە دەکات، هەروەها ئەوە دەردەخات کە پیتێک ڕەشکرابێتەوە و وشەکە کورت کرابێتەوە.

Add an apostrophe…

ئەم کۆمایە لەم حاڵەتانەی خوارە بەکاربهێنە.

Rule 1: When there is one owner, add an apostrophe to the noun, and then add an (s).

ڕێسای یەکەم: لەحاڵەتی خاوەنداریەتیدا، ئەم کۆمایە بۆ ناوەکە زیاد بکە پاشان پیتی (ئێس) بنوسە.

The cat's dish is empty. قاپی پشیلەکە هیچی تێدانیە.

Rule 2: When there is more than one owner; add an S first and then an apostrophe.

ڕێسای دووەم: ئەگەر زیاتر لە یەک خاوەنداریەتی هەبوو، سەرەتا پیتی (ئێس) بنوسە پاشان کۆماکە زیاد بکە.

All of the cats' dishes were empty.

قاپەکانی پشیلەکان هیچی تێدانیە

Rule 3: When you put two words together to make a contraction.

ڕێسای سێیەم: کاتێک دوو وشە پێکەوە دەنێی بە مەبەستی کورت کردنەوە.

Now, Sana's (Sana is) on the table. سەنا لەسەر مێزەکەیە.

*** *** ***

**Hyphens .** هێڵێ بچوک (هێڵی بەیەک گەیاندنی دوو وشە)

Are used to form compound words or join word units. They are also used to join prefixes, suffixes, and letters to words.

ئەم هێڵە بەکاردەهێنرێت بۆ دروست کردنی وشەی لێکدراو یان پێوە لکاندنی بەشەکانی وشە. هەروەها بۆ لکاندنی پێشگر و پاشگر و پیتەکان بە وشەکانەوە بەکاردەهێنرێت.

Rule 1: Create compound words.

ڕێسای یەکەم: ئەم هێڵە بەکاردەهێنرێت بەمەبەستی دروستکردنی وشەی لێکدراو.

Spider-Man is my favourite superhero.

Rule 2: Generally, hyphenate between two or more adjectives when they come before a noun and act as a single idea.

ڕێسای دووەم: بەگشتی، ئەم هێڵە بخەرە نێوان دوو یان زیاتر لەدوو ئاوەڵناو کاتێک ئەم دوو ئاوەڵناوە لەپێش ناو دێن و پێکەوە یەک مانا دەدەن.

Friendly-looking lady

Rule 3: Use hyphens with compound numbers from twenty-one to ninety-nine…

ڕێسای سێیەم: ئەم هێڵە بۆ ژمارە لێکدراوەکان بە کاربهێنە لە بیست و یەکەوە بۆ نەوەت و نۆ...

Twenty-two students.

Rule 4: Use a hyphen with the prefixes ex-, self-, and all-; with the suffix -elect; and with all prefixes before a proper noun or proper adjective.

یاسای چوارەم: ئەم هێڵە لەگەڵ پێشگرەکانی وەکو (ئێکس، سێڵف، ئۆڵ) هەروەها لەگەڵ پاشگری (ئیلێکت) بەکاربهێنە، هەروەها لەگەڵ هەموو پێشگرەکان لەپێش ناوی تایبەتی یان ئاوەڵناوی تایبەتی.

Ex-wife, all- star, senator-elect, anti-Semitic, non-European self-control.

*** *** ***

:

## Colons

جوتە خاڵ

Colons follow independent clauses and call attention to the information that comes after.

جوتە خاڵ لە دوای برگەی سەربەخۆ (شارستە) دێت کە زانیاری دوای خۆی پەیوەندیدارە بە پێش خۆی.

- To introduce a list.

هەروەها بۆ بەرجەستە کردنی لیستێک لە شت بەکاردێت.

Please bring the following items to class: pencil, paper, eraser, and folder.

***   ***   ***

## Dashes

داش -

Dashes often confused with hyphens- connect groups of words to other groups of words to emphasize a point. Usually, the dash separates words in the middle or at the end of a sentence.

ئاڵۆزیەک لە نێوان هێڵێ بچوک و داش هەیە- کە گروپێکی وشە وابەستەی گروپێکی دیکەی وشە دەکەن بۆ تەئکید کردنەوە. عادەتەن، داش دوو وشە لە ناوەڕاست یان لە کۆتایی ڕستە جیادەکاتەوە.

- In the middle of a sentence, a dash can put special emphasis on a group of words or make them stand out from the rest of the sentence. At the end of a sentence, a dash separates information from the rest of the sentence.

لە ناوەندی ڕستەدا، داش تەئکید کردنەوەیەکی تایبەت بە کۆمەڵە وشەیەک دەدات یان لە بەشەکەی دیکەی ڕستە جیایان دەکاتەوە. لە کۆتایی ڕستەشدا ئەم (داش)ە زانیاری کۆتایی لە ڕستەی پێش خۆی جیا دەکاتەوە.

The eighteenth-century manuscript is interesting.

*** *** ***

## Semicolons ; کۆمای

### خاڵدار

Are separate clauses or phrases that are related and that receive equal emphasis.

بڕگە یان دەستەواژەی پەیوەندیدار جیادەکەنەوە و بەمەش تەئکیدکردنەوەیەکی هاوسەنگ بەرجەستە دەکات.

Rule 1: to separate clauses.

ڕێسای یەکەم: بۆ جیاکردنەوەی بڕگەکان.

Jack has a big test tomorrow; he cannot go out tonight.

Rule 2: Semicolons help avoid confusion in lists where there are already commas.

ڕێسای دووەم: کۆمای خاڵدار یارمەتیدەر دەبێت بۆ دورکەوتنەوە لە ئاڵۆزی کۆمەڵە ئامرازێک کە کۆمای تێدا بێت.

We traveled to London, England; Paris, France; Berlin, Germany; Sofia and Bulgaria.

*** *** ***

## Full Stops

خاڵ .

Are used to divide text and create boundaries by marking the end of a sentence.

خاڵ بەکاردەهێنرێت بۆ دابەش کردنی دەق و دروست کردنی سنور بە دانان لە کۆتایی ڕستە.

Rule 1: Use the full stop after a complete sentence.

ڕێسای یەکەم: خاڵ بەکاربهێنە لەکۆتایی ڕستە.

I saw him.

Rule 2: After the salutation of a business letter.

ڕێسای دووەم: لەدوای سڵاو کردن لە نامەی بازرگانیدا.

Dear Mr. Sami.

***  ***  ***

## Question Marks

نیشانی ؟ پرسیار

Rule 1: Use a question mark only after a direct question.

ڕێسای یەکەم: نیشانەی پرسیار لەکۆتایی پرسیاری ڕاستەوخۆ بەکاربهێنە.

Will you go with me?

Rule 2: Use a question mark when a sentence is half statement and half question, like in tag question.

ڕێسای دووەم: نیشانەی پرسیار بەکاربهێنە کاتێک کە دەربڕینێک نیوەی ڕستەیە و نیوەکەی دیکەی پرسیارە، واتە: لە (کلکە پرسیار).

You do care, don't you?

*** *** ***

## Exclamation Points نیشانەی سەر ! سورمان

- Use exclamation points to show emphasis or surprise. Do not use the exclamation point in formal business letters.

ئەم نیشایە بەکاربهێنە بۆ نیشاندانی تەئکیدکردنەوە و سەرسوڕمان. لەنامەی بازرگانیدا ئەم نیشانەیە بەکارمەهێنە.

What a beautiful day!

# Section Four

# بەندی چوارەم

## Spelling

## حینجه کردن

1. If the verb ends in a consonant + vowel + consonant (cvc), we double the final consonant and add (ing), as it is explained in the below table.

ئەگەر وشەیەک بە پیتی نەبزوێن + بزوێن+ نەبزوێن کۆتایی بێت ئەوا پیتی کۆتایی دەکەین بە دوو و پاشان (ئای ئێن جی) بۆ زیاد دەکەین. هەروەکو لەم خشتەیە ڕوونکراوەتەوە.

| Infinitive | ING form |
|---|---|
| To stop | Stopping |
| To sit | Sitting |
| To plan | Planning |
| To get | Getting |
| To swim | Swimming |

2. If the verb ends in (ie) we change it to (y ing) , as it is explained in the below table.

ئەگەر فرمان کۆتایی بە (ئای ئی) بێت ئەوا دەیگۆڕین بۆ (وای- ئای ئێن جی)، هەروەکو لەم خشتەیە ڕوونکراوەتەوە.

| Infinitive | ING form |
|---|---|
| To lie | Lying |
| To die | Dying |
| To tie | Tying |

3. If the verb ends in consonant + vowel + L, we normally double the final (l) and add ING.

ئەگەر فرمانێک کۆتایی بە پیتی نەبزوێن +بزوێن + ئێڵ بێت، ئەوا (ئێڵ)ی کۆتایی دەکەین بە دوو پاشان (ئای ئێن جی) بۆ زیاد دەکەین.

Note: In the United States (US) they do not double the L when the stress is on the first syllable, as it is explained in the below table.

تێبینی: لە ئینگلیزی ئەمریکیدا (ئێڵ) نابێت بە دوو ئەگەر هێزی دەربڕین لەسەر بڕگەی یەکەم بێت. هەروەکو لەم خشتەیە ڕوونکراوەتەوە.

| Infinitive | Ing form (UK) | ING form (US) |
|---|---|---|
| to travel | Travelling | traveling |
| to marvel | marvelling | marveling |

4. If the verb ends in a stressed vowel + R, we double the final (r) and add ING. As I mentioned in the table.

ئەگەر فرمانەکە کۆتایی بە پیتی بزوێنی هێزداری + (ئاڕ) بێت ئەوا کۆتا (ئار) دەکەین بە دوو و پاشان (ئای ئێن جی) زیاد دەکەین. هەروەکو لە خشتەکدا ئاماژەم پێکردوە:

| Infinitive | ING form |
|---|---|
| Refe | Referring |
| Defe | Deferring |

# Chapter Two

## بەشی دووەم

## Section One

## بەندی یەکەم

### Nouns

### ناو لە زمانی ئینگلیزیدا

A noun: is a word that identifies a person, animal, place, thing, or idea.

**ناو: وشەیەکە کە وەسفی کەسێک، ئاژەڵێک، شوێنێک، شتێک یان بیرۆکەیەک دەکات.**

# Types of nouns:

# جۆرەکانی ناو

## The first one: Concrete nouns

**یەکەمیان: ناوی بەرجەستە**

Concrete nouns means the nameof people, places, or things that you can touch, see, hear, smell, or taste.

**مەبەست لە ناوی بەرجەستە ئەوەیە کە، ناوی خەڵک و شوێن و شت دەگرێتەوە دەتوانیت دەستیان لێبدەیت، بیان بینی، بۆنیان بکەی و تامیان بکەی.**

| Person<br>ناوی کەس | Place<br>شوێن | Thing<br>شت |
|---|---|---|
| Doctor<br>دکتۆر | River<br>ڕووبار | Book<br>پەرتوک |
| Man<br>پیاو | England<br>ئینگلتەرا | Dog<br>سەگ |

## The second one: Abstract nouns

**دووەمیان: ناوی مەعنەوی**

Abstract nouns are ideas, concepts, or emotions. These nouns are intangible, which means you cannot touch, see, hear, smell, or taste them.( **using your five senses**).

مەبەست لەناوی مەعنەوی ناوەکانی، بیرۆکە، چەمک و هەست وسۆز دەگرێتەوە. ئەم ناوانە هەستیان پێناکرێت، ئەمەش بەمانای ئەوەی کە ناتوانرێت دەستیان لێبدەی، بییان بینی، بیان بیستی، بۆنیان بکەی یاخود تامیان بکەی.

| Idea<br>بیرۆکە | Emotion<br>هەست |
|---|---|
| Love<br>ئەشق | Anger<br>تووڕەیی |
| Intelligence<br>زیرەکی | Fear<br>ترس |
| Justice<br>دادگەری | Excitement<br>دڵخۆشی |

The third one: A collective noun

سێیەمیان: ناوی کۆ (کۆمەڵ)

A collective noun is a word that refers to a group. It can be either singular or plural, but is usually used in the singular.

ناوی کۆ ئەو ناوانە دەگرێتەوە کە ئاماژە بە گروپێک دەکەن، ئەو ناوانەش دەکرێت تاک بن یا کۆ، بەڵام عادەتەن وەکو تاک مامەڵەیان لەگەڵ دەکرێت.

Team, herd, class, family…

تیم، ڕەوە، پۆل،خێزان...

The fourth one: Common Nouns

چوارەمیان: ناوی گشتی

Common nouns are used to refer to general things rather than specific examples. Common nouns are not normally capitalized unless they are used as a part of a proper name or are placed at the beginning of a sentence. Some common noun examples are included in the following sentences.

ئەم ناوانە ئاماژە بەشتی گشتی دەکەن زیاتر لەوەی کە ئاماژە بن بۆ ناوی تایبەت. پیتی یەکەمی ئەم ناوانەش بە گەورەیی نانوسرێت مەگەر بکەونە پاڵ ناوی تایبەتی یان لەسەرەتای ڕستەوە بێن، ئەمانەی خوارەوەش چەند نمونەیەکن.

University, country, bridge, city, birth, day

## Countable and Uncountable Nouns

## ناوی ژمێردراو نەژمێردراو

A noun can be countable or vice versa.

ناو دەشێت ژمێردراو بێت یانیش بەپێچەوانەوە.

### Countable Nouns

### ناوە ژمێردراوەکان

Countable nouns: are those nouns that we can count them, they have a singular and a plural form. The singular form can use the determiner "a" or "an". "How many?"

مەبەست لەناوە ژمێردراوەکان ئەو ناوانەیە کە دەتوانرێت بژمێردرێن، شێوەی تاک و کۆ وەردەگرن و شێوەی تاک ئامرازەکانی (ئەی و ئەن) وەردەگرن. هەروەها بە (هاو مەنی) پرسیار لەو ناوانە دەکەین.

| Singular | Plural |
|---|---|
| One/a dog | Two dogs |
| One/a man | Two men |
| One/an idea | Two ideas |
| One/a shop | Two shops |
| One/a horse | Two horses |

How many dogs does she have? ئەو چەند سەگی هەیە؟

She has three dogs. سێ سەگی هەیە.

